

# دەجال بناسە

نوسینی

لێکۆڵەر ئەبی عبدالله کوردستانی

ئامادەکردنی

خادم الإسلام

١٤٤٠ کۆچی / ٢٠١٩ زاینی

# ناوەڕۆک

# دەججال بناسە

بسم الله الرحمن الرحيم

## بەشی یەکەم: پێشەکی لەسەر "دەججال"، ئایا لە قورئان باسی کراوە؟

**سەرەتا پێشەکییەک لەسەر (أعور الكذاب):**

یەکێک لە باسە گرنگ و ورد و مەترسیدارەکان دەججالە! کە رسول الله ﷺ پێمان دەفەرمووێت هیچ پێغەمبەرێک نییە تەنیا قەومەکەی لە "دەججال" ئاگادارکردووەتەوە و یەکێکە لەگەورەترین فیتنەکانی زەوی و پێمان دەفەرمووێت هەر لە "ئادەم" تاوەکو خاتەم کۆتا بەشیر، فیتنەی وا گەورە نییە و نەبووە و ناشبێت. بۆیە منیش لەسەر هەمان ئاگادار کردنەوە تابتوانم خەڵکی لەم مەترسییە ئاگادار دەکەمەوە. دەججال واتە (كذاب)، واتە درۆزن وانیشان دەدات بەهەشتی پێیە، بەڵام جەهەننەم لەدەستیایەتی. یەکێک لەهاوەڵان زۆر ترسا دەیووت یا رسول "دەججال" دەڵێن چیایەک نان و ئاوی پێیە، بۆیە دەترسم زیانم پێ بگەیەنێت رسول الله ﷺ فەرمووی: هیچ نییە، هو أهون عند الله[1].

ئنجا لە قورئاندا هیچ نەسێک بەڕاستەوخۆ نییە باس لە دەججال بکات. بەڵام وەک مەهدی ئیشارەی پێکراوە و لەزۆرترین (صحيح و مسندەكان) بەفەرموودەی

---

١ رواه بخاری



تەواو ڕاست و دروست هاتووە کەواتە عقیدەی (أهل السنه و الجماعه) ئەوەیە بڕوای تەواومان پێی هەیە چونکە، قال الله تعالی: ﴿وما ينطق عن الهوى﴾.

بەڵام دەتوانین بڵێین باس لە کەسایەتی "دەجال" بەڕاستەوخۆ هاتووە وەک "سامری" کە والله أعلم زۆرینە پێیان وایە دەجال بێت. دواتر بإذن اللّه بەپووختی دێینە سەری.

ئەمە پووختەی چەند فەرموودەیەکی "بوخاری" و "موسلیم"بوو لەسەر پێشەکی کەدواتر بە ووردی دێینە سەر باسیان. بۆیە پرسیارەکان با هەریەکە و لەبەشی تایبەت بەخۆی بێت.



## بەشی دووەم: ناوی "دەجال" و لەدایک بوونی.

لەسەرەتادا وەکو بیرهێنانەوە "دەجال" بە یەکەم نیشانەی گەورەی قیامەت دانراوە و بەمەترسیدارتین سەر ڕووی زەوی دانراوە. دەجال وەکو ناسین ناسراوە بەڵام ئەم ناسینەش تەنیا تایبەت بە ئیمانداران واتە فەرموودەکان ناسینەکەیان تایبەت کردووە بە ئیمانداران. جا خوێندەواربێت یان نەخوێندەواربێت بەئاسانی دەتوانێت وشەی کفری نێوچەوانی بخوێنێتەوە، ئەمەش وەکو چاکەی الله یە بەسەر ئیمانداران، بەڵام ئیماندار بەمانای کەلیمە واتە (قول و فعل) ئیمانداربێت گەرنا ناسینی زۆر زەحمەتە. ناوی دەجال لەفەرموودەکاندا بەچەند شێوەک هاتووە.

**<u>یەکەم: المسیح الدجال.</u>**

ئەمەیان گەورەترین و ناسراوترین ناوە، بۆیە زاناکان بۆ ئەم ناوە دوو ڕایان هەیە..

**یەکەمیان:** چاوێکی کەوا ڕاستەکەی وایە چاوی ڕاستە ڕەشبووەتەوە. لەفەرموودەیەکدا دەڵێت: كأن عينه عينبا طافيه. واتە وەکو ترێی دەرپەڕیو وایە.

**دووەمیان:** دەڵێن زەوی هەموو (مسح) واتە دەگەڕێت و پاکی دەکاتەوە لەئیمان تەنیا ئەم شوێنانەی باسکراون، ئەوانیش (مەککە) و (مەدینە) وەک لەم فەرموودەیە: المدينه لايدخل دجال ولاالطاعون يان على أنقابى ملائكه.

**<u>دووەم: أعور الكذاب.</u>**

ئەمەش هاتووە ئیمامی "بوخاری" ڕیوایەتی کردووە لە کتاب (الفتن)دا، واتە کۆرەی درۆزن. بەڵێ درۆزنترین کەسە لەسەر زەوی چونکە خەڵکی بانگ دەکات بەرەو گومڕایی.

**<u>سێیەم: دەججال لە زۆرینەی فەرموودەکاندا.</u>**

دەججال لە زۆرینەی فەرموودەکاندا ئەم وشە هاتووە، بۆنمونە لەم فەرموودەیەی "موسلیم" ڕیوایەتی کردووە، (الدجالون كذابون) واتە لەهەموو حاڵەتەکاندا درۆ دەگرێتەوە.

وەکو شەخس لە فەرموودەکان و لە ڕای زاناکان چەند کەسێک هاتوون کە هەریەکەو بەشێوەیەک لێکدانەوەی بۆکراوە.



١. **سامری:** ئەم کەسە لە قورئانیشدا ناوی هاتووە دواتر بإذن اللّٰه دێینە سەرباسی.

٢. **إبن صیاد:** ئەمەشیان گەنجێک بوو لەسەردەمی رسول الله ﷺ زۆرینەی هاوەڵان دەیان ووت "دەججال"ە دواتر ئەمەش باس دەکەین.

٣. **الجساسە:** ئەمەشیان لە (تمیم داری)دا هاتووە لە دوورگەیەکدابووە بەشێکی زۆری زاناکان دەڵێن "دەججال"ە.

### ئایا دەججال لەدایک بووە؟

بەڵێ لەدایک بووە، بەڵام کاتی لەدایک بوونی نازانرێت تەنیا ئەوەندە کافیە بۆ ئێمە.



## بەشی سێیەم: ئایا "دەججال" کێیە؟ شەیتانە یان مرۆڤە؟

وەکو بەبیرهێنانەوەیەک بابەتی "دەججال" زۆر ئاڵۆزە، هەروەها هەریەکە و بەجۆرێک وەریگرتووە، ئنجا هەندێک باسی تێکەڵە. یەکێک لەوانە ئایا دەججال مرۆڤە واتە لەنەوەی ئادەمە یان هەر خودی شەیطان "دەججال"ە. دەمەوێت بإذن اللّٰه ئەم باسەشتان بۆ یەکلایی بکەمەوە کەوا کامیان حەقیقەتەکەیە.

### لەسەرەتادا دەبێت بزانین (شیطان) کە پێشتر یەکێک لەناوەکانی "ئیبلیس" بوو کێیە و نەوەی کێیە؟



بەکورتی وەک دەزانن بەر لەدروست بوونی مرۆڤ جن هەبوون بەهەزاران ساڵ پێش مرۆڤ لەسەر زەوی. ئنجا نەوەی (جان)ی لەسەر بوو، جانیش باپیرە گەورەی جنۆکەیە و باپیرە گەورەی شەیطانە. هەروەک قال الله تعالی: ﴿والجان خلقناه من قبل من نار السموم﴾[1]. واتە جن لە ئاگرن وەک دەبینین کاتێک شەیطان سوجدە نابات (الله) پێی دەفەرمووێت: بۆچی سوجدەت نەبرد ئەویش دەڵێت من چاکترم لە ئەو "أنا خيرمنه" ، بۆ؟ چونکە (خلقتني من نار وخلقته من طين). تائێستاش واتە هەزاران ساڵە نەمردووە و دەژیەت و لەژیاندایە، چونکە (الله) بەڵێنی پێداوە لەسەر داواکاری خۆی. بۆیە دەمەوێت بۆ ئەوەی شتەکە لەلاتان ڕوونبێت و گومان نەمێنێت، دێینە سەر باسی ئەوەی کەوا چی کاتێک دەمرێت! بۆ ئەمەش دەبێت بگەڕێینەوە بۆ قەولی موفەسیرین، ئەویش ئەم ووشانە ﴿قَالَ إِنَّك مِنَ الْمُنظَرِين﴾ یان ﴿وقت المعلوم﴾.

**یەکەم: تەفسیری (طبري).**

قال تعالی: ﴿إِنَّك مِنَ الْمُنظَرِينَ﴾

وبنحو ذلك كان السدي يقول:

حدثني موسى بن هارون قال حدثنا عمرو قال، حدثنا أسباط عن السدي: ﴿قَالَ رَبِّ فَأَنْظِرْنِي إِلَى يَوْمِ يُبْعَثُونَ۝ قَالَ فَإِنَّك مِنَ الْمُنْظَرِينَ۝ إِلَى يَوْمِ الْوَقْتِ الْمَعْلُوم﴾[2]، فلم ينظره إلى يوم البعث، ولكن أنظره إلى يوم الوقت المعلوم، وهو

---

١ سورة الحجر: الآية ٢٧

٢ سورة الحجر ص: الآية ٨٠ -: الآية ٣٦ - ٣٨ و سورة ٨١

يوم ينفخ في الصور النفخة الأولى، فصعق من في السموات ومن في الأرض، فمات (٢٠)[1].

لێرەدا ئیمامی "تەبەڕی" لەڕێگەی (سدی) هێناویەتی بەوەی مەوعیدەکەی تاوەکو نەفخەی یەکەمە واتە مردنی هەموو بەشەریەت و نەمانی کەس تەنیا ئەوانەی الله ویستی لەسەربێت.

قال أبو جعفر: فتأويل الكلام: قال إبليس لربه: " أنظرني"، أي أخرني وأجلني، وأنسئ في أجلي، ولا تمتني - إلى يوم يبعثون، يقول: إلى يوم يبعث الخلق. فقال تعالى ذكره: ﴿إنك من المنظرين﴾ إلى يوم ينفخ في الصور، فيصعق من في السموات ومن في الأرض إلا من شاء اللّه.

دیسانەوە کاتەکەی بەنەفخەی یەکەم دانراوە واتە لەنێوان نەفخەی یەکەم و دووەم العلم عند الله تعالى..

**دووەم: تەفسیری (قرطبي).**

قال تعالى: ﴿إِنَّك مِنَ الْمُنظَرِينَ﴾[2]

فقال اللّه تعالى: ﴿إنك من المنظرين﴾ قال ابن عباس والسدي وغيرهما : أنظره إلى النفخة الأولى حيث يموت الخلق كلهم. وكان طلب الإنظار إلى النفخة الثانية حيث يقوم الناس لرب العالمين، فأبى اللّه ذلك عليه. وقال: إلى يوم يبعثون ولم

١ تفسير طبري (١٤٣٦٠).

٢ سورة الأعراف: الآية ١٥



يتقدم ذكر من يبعث، لأن القصة في آدم وذريته ، فدلت القرينة على أنهم هم المبعوثون.

ئيمامی "قورتوبی"ش لەڕێگەی (سدی و إبن عباسە)وە، دەڵێن کەوا کاتی مردنی لەنەفخەی یەکەم دایە واتە دیسانەوە دوای مردنی هەموو بەشەریەت و ئەوانەی تر تەنیا ئەوانەی الله ویستی لەسەریانە. دیسانەوە ئیمامی "قورتوبی" بەڵام لەسورەتی جیاوە. تەفسیری "قورتوبی"، ﴿إِلَىٰ يَوْمِ الْوَقْتِ الْمَعْلُومِ﴾[1]

أخر إلى وقت معلوم، وهو يوم يموت الخلق فيه.

واتە ئەو ڕۆژەی (خلق) لێرەدا گشتگیرترە بەوەی ئەوڕۆژەی کەوا هەموو (خلق) دروستکراوەکان تیایدا دەمرن ئەمیش کاتی (نەفخەی صوری یەکەم)ە.

**سێیـەم: تەفسیری (البغوي).**

ئەمجارەیان ئیمامی "بەغەوی"  لە تەفسیری هەردوو ئایەت و هەردوو سورەتی جیاوازەوە دەڵێت کاتی مردنی شەیتان  واتە کاتەکەی کەوا لەلایەن الله وە وەعدی پێدراوە نەفخەی یەکەمە کاتی مردنی هەموو دروستکراوەکان.

قال تعالى: ﴿إِنَّكَ مِنَ الْمُنظَرِينَ﴾[2]

١ سورة الحجر: الآية ٣٨  و سورة ص: الآية ٨١
٢ سورة الأعراف: الآية ١٥



(قال) اللّه تعالى: ﴿إنك من المنظرين﴾ المؤخرين، وبين مدة النظر والمهلة في موضع آخر فقال: ﴿إلى يوم الوقت المعلوم﴾، وهو النفخة الأولى حين يموت الخلق كلهم.

تفسير البغوي ﴿إِلَىٰ يَوْمِ الْوَقْتِ الْمَعْلُومِ﴾[1] (إلى يوم الوقت المعلوم) وهو النفخة الأولى.

ئێستا دێینە سەر شیکردنەوەی. بۆیە لێرەدا دەستم پێکرد واتە باسکردنی شەیتان، چونکە بەڵگەی مەلمووس و موقنیعمان هەیە و یەکلاکەرەوەیە. لەتەفسیری زۆرینەی موفەسیرانی ئیسلام یان کیباری موفەسیرین ئاماژە بەوە دەکەن شەیتان کۆتا کەسە، لەبەرئەوەی لەکاتی (نەفخەی یەکەم) دا دەمرێت.

ئێستا ئێمە چیمان بۆ دەرکەوت؟ ئێمە چەند خاڵێکی زۆر گرنگمان دەستکەوت، لەوانەش "دەجال" بە یەکێک لە (نیشانە گەورەکان) دادەنرێت!! ئنجا کاتی مردنیش زۆر ڕوونە و دیاری کراوە بۆمان و تەنانەت پێمان ووتراوە لە سەردەستی "عیسا" علیه من الله أفضل الصلاة والسلام دەکوژرێت. هەروەها بەشمشێریش دەکوژرێت. کەواتە پێویستە بزانین لەنێوان کوشتنی "دەجال" و (نەفخەی یەکەم) چەندەها ساڵ هەیە دوای کووشتنی دەجال. "عیسا" علیه السلام حوکم دەکات دواتر (یەئجوج و مەئجوج) دێن و دواتر چەندەها نیشانەی تر و دواتر (با)یەک دێت هەرچی ڕۆحی ئیمانداره دەبات و دەیکێشێت تەنیا شرار الناس دەمێنن.

---

١ سورة الحجر: الآية ٣٨ و سورة ص: الآية ٨١



لەفەرموودەکان والله أعلم "عبداللەی کوڕی مسعود" دەڵێت: لاتقوم الساعة إلا علي شرار الناس.

واتە قیامەت هەڵناستێت تەنیا لەسەر خراپترینی خەڵک نەبێت.

وەک دەزانین دوای کێشانی ڕۆحی ئیمانداران، چینە خراپ خراپەکەی خەڵک دەمێنن ئینجا قیامەت هەڵدەستێت. ئەم گرێ کوێرەشمان کردەوە ذالك فضل اللّه. ئێستا بۆ هەموو لایەک ڕوونبووەوە کە "دەجاڵ" مرۆڤە و پەیوەندی بە شەیتانەوە نییە.



## بەشی چوارەم: دوو خاڵی گرنگ لەسەر "دەجاڵ".

لەم بەشەدا هەوڵدەدەین پشتیوان بە الله باسی دووخاڵ بکەین.

**یەکەم:** بەڵگەی (صحیح) لە فەرموودە کە "دەجاڵ" (شیطان) نییە.

**دووەم:** ئایا "دەجاڵ" لەدایک بووە و پاشان کەی لەدایک بووە؟

### یەکەم: بەڵگەی صحیح لەفەرموودە کە "دەجاڵ" (شیطان) نییە.

لەبەشی پێشوتردا لە تەفسیری زۆرینەی موفەسیران یان کیباری موفەسیرین باسمان کرد کەوا شەیتان چی کاتێک دەمرێت. بۆئەوەی زیاتر بیسەلمێنم و هیچ شک و گومانێک نەبێت کە "دەجاڵ" (شیطان) نییە، فەرموودەیەکی (صحیح)

باسدەکەم کە ئیمامی "موسلیم" ڕیوایەتی کردووە. بۆیە زیاتر تەرکیز لەسەر ئەم خاڵە دەکەمەوە چونکە تائێستاش خەڵکێکی زۆر وا دەزانن "دەجال" (شیطان).

فەرموودەکە درێژە بەڵام من بەشێکیم داناوە ئەویش صحیح مسلم (کتاب فتن والملاحم). (يخرج الدجال في أمتي فيمكث أربعين لا أدري أربعين يوما أو أربعين شهرا، أو أربعين عاما- فيبعث اللّٰه عيسى ابن مريم، كأنه عروة بن مسعود، فيطلبه فيهلكه، ثم يمكث الناس سبع سنين، ليس بين اثنين عداوة، ثم يرسل اللّٰه ريحا باردة من قبل الشأم، فلا يبقى على وجه الأرض أحد في قلبه مثقال ذرة من خير أو إيمان إلا قبضته، حتى لو أن أحدكم دخل في كبد جبل لدخلته عليه حتى تقبضه). قال: سمعتها من رسول اللّٰه (ﷺ)، قال: (فيبقى شرار الناس في خفة الطير وأحلام السباع، لا يعرفون معروفا ولا ينكرون منكرا، فيتمثل لهم الشيطان فيقول: ألا تستجيبون؟ فيقولون: فما تأمرنا؟ فيأمرهم بعبادة الأوثان).

ئەوەی من دەمەوێت تەرکیزتان بخەنەسەری لەکۆتاتیدا دەفەرموویێت شەیتان دێتە لایان واتە دوایی کوشتنی "دەجال" و حەوت ساڵ حوکمی "عیسا" علیه سلام دوای نەمانی ئیمانداران. ئینجا دوای چەندەها ساڵ شەیتان دێت و پێیان دەڵێت ئایا وەڵامم نادەنەوە! ئەوانیش پێی دەڵێن چیت فەرمانە ئەویش فەرمان بەبت پەرستی دەکات بۆیان. ئەمە دەلیلی موقنیع و قەطعییە پێویست ناکات زیاتر لەسەری بڵێم، کەواتە دەجال (شیطان) نییە. ئەوانەی وا دەڵێن بەڵگەی بەهێزیان نییە، والله تعالی اعلی واعلم.

**دووەم: ئایا (دەجال) لەدایک بووە و پاشان کەی لەدایک بووە؟**



لێرەشدا نامەوێت خۆم لەهەندێک ئاڵۆزی و تێکەڵی بدەم وەک ئایا "سامری" دەججالە یان بەسەرهاتی "جەساسە" دەججالە یان "إبن صیاد" دەججالە من لێرەدا هەر سێ واقعەکە بەجۆرێکی تر بەکاردێنم.

**یەکەم:** بەسەرهاتی "سامری" کە زۆرینەتان بیستووتانە لە قورئاندا لە سورەتی (طه)دا بەدرێژی باسکراوە لەسەردەمی "مووسا"دا.

**دووەم:** "إبن صیاد" کەوا دیسانەوە بیستوتانە لەچەند فەرموودە و ئاثری (صحیح)یدا هاتووە کە هەم ئیمام "بوخاری" و هەمیش ئیمام "موسلیم" ڕیوایەتیان کردووە، تەنانەت هاوەڵان سوێندیان خواردوە کەوا "دەججال"بووە.

**سێیەم:** فەرموودەی "تمیم داری" کە بەسەرهاتی "جەساسە"ی پێ دەڵێن ئەمیش بەشێکی زۆر پێیان وایە دەججالە. ئەمیش ئیمامی "موسلیم ڕیوایەتی کردووە لەکتاب (الفتن والملاحم)دا.

لێرەدا هەرسێ بەڵگەکە بۆئەوە بەکاردێنم کەوا "دەججال" زۆر لەمێژە لەدایک بووە و هەزاران ساڵە دەژیەت، واتە تەمەنێکی زۆر زۆری هەیە و لە ئێستاشدا دەورێکی کارای هەیە واتە دەججال گەلێک لەمێژە دەستێکی باڵای لە فیتنەکانی سەر زەوی هەبووە. ئنجا لەکۆتایشدا فیتنە الکبری گەورەترین فیتنەی زەوی بەرپا دەکات.



## بەشی پێنجەم: چۆن "دەجال" دەناسی؟

لەم بەشەدا بإذن اللّه دەمەوێت کورتەیەکی پووخت لە ناسینەوەی خودی دەجال باسبکەم واتە پێویست ناکات بەوردی بچینە نێو باسەکە ئایا شەکڵ و شێوەیی چۆنە چۆن نیە بەڵکو چەند خاڵێکی گرنگ و ئەساسی باس دەکەم بۆ ناسینەوە. بەکورتی "دەجال" کەسێکی توکنە و باڵای درێژ نییە. من دووخاڵ باسدەکەم هەروەک چۆن رسول الله ﷺ زۆر بەگرنگی باسی ئەم دووخاڵەی کردووە.

**خاڵی یەکەم: "دەجال" چاوێکی کوێرە.**

واتە لەو فەرموودانەی باس لە دەجال دەکرێت کە زۆر گرنگە پێغەمبەر ﷺ زۆر دەیفەرموو، ئەو واتە دەجال (أعور العين اليمنى) لە هەندێک فەرموودە (يسرى). بەڵام ڕای ڕاجح لای ڕاستە، چونکە ئیمامی بوخاریش زیاتر ڕیوایەتەکانی لای ڕاستە، بۆنمونە دەفەرموێت خوای گەورە کوێر نییە بەڵام دەجال کوێرە ئەمەش بۆیە چونکە دەجال بانگەشەی خوایەتی دەکات. بۆنمونە ئەم فەرموودە کە ئیمامی (بخاری و امام مسلم و امام احمد و ئیمامی ترمزی و امام مالک و امام أبی داود) و چەندانی ڕیوایەتیان کردووە.

عن ابن عمر، أراه عن النبي ﷺ، قال: (أعور عين اليمنى، كأنها عنبة طافية).
واتە دەفەرموێت چاوێکی لای ڕاستی کوێرە و وەکو دەنکە ترێی دەرپەڕیو وایە.

**خاڵی دووەم: لەنێو چاوانی (کافر) نوسراوە.**



ئەم خاڵە زۆر گرنگە بۆمان واتە ئیمانداران. بۆنمونە ئەم فەرموودە کە هەریەک لە (ئیمام بخاری و امام مسلم و امام احمد امام مالک) لە "موطأ" و چەند پێشەوایەکی تریش ڕیوایەتیان کردووە.

عن أنس رضي الله عنه قال : قال النبي ﷺ: (ما بعث نبي إلا أنذر أمته الأعور الكذاب، ألا إنه أعور، وإن ربكم ليس بأعور، وإن بين عينيه مكتوب كافر. فيه أبو هريرة وابن عباس ، عن النبي ﷺ).

ئەوەی گرنگە لەم فەرموودە ئەوەیە پێمان دەڵێت کە لە نێوچاوانی وشەی (کوفر) نوسراوە. بەڵام من تیشک دەخەمە سەر شتێک کەوا زۆر باسنەکراوە یان بەهەند وەرنەگیراو ئەویش ئەم نوسینەی نێوچاوانی تەنها و تەنها کەسانی ئیماندار دەیبینن و دەیخوێننەوە واتە مەرجە کە دەبێت ئیمادداربێت لەم فەرموودە باس نەکراوە بەڵام لەفەرموودەیەک تردا هاتووە، وەک  لەم ڕیوایەتانەدا.

وفي حديث أنس رضي الله عنه : قال النبي ﷺ : (ما بعث نبي إلا أنذر أمته الأعور الكذاب ألا إنه أعور وإن ربكم ليس بأعور وإن بين عينيه مكتوب كافر)[1]. وفي رواية : (ومكتوب بين عينيه ك ف ر)[2]. وفي رواية عن حذيفة: (يقرؤه كل مؤمن كاتب وغير كاتب)[3] .

کە لەڕیوایەتی "حذیفە"دا تەنها ئیماندار دەیخوێنێتەوە و دەڵێت گەربێتو خوێندەواربێت یان نەخوێندەواربێت. ئەوەی گرنکە دەججال وەکو خوا خۆیی نیشان دەدات و زۆرینەش شوێنی دەکەون جگە لە ئیمانداری (ملتزم) نەبێت.

١ رواه البخاري برقم ٦٥٩٨
٢ رواه مسلم برقم ٥٢١٩
٣ رواه مسلم برقم ٥٢٢٣



## بەشی شەشەم: شوێنی دەرچوون و سەرخەرانی "دەجال".

لەم بەشەدا باسی یەکەم شوێن کە دەجال لێوەی دەردەچێت و یەکەم گەل و قەوم کێن دوای دەجال دەکەون. ئنجا لەبەرئەوەی دەکرێتە کتێب بۆیە هەموو فەرموودەکان بە نەص و سەرچاوەوە نەقڵ دەکەم بإذن اللّه تعالی.

**یەکەم: لەلایەنی قەوم، واتە شوێنکەوتە:**

یەکەم گەل و قەوم لەفەرموودەکاندا هاتبێت "جوولەکەن"! وەک ئەم فەرموودە کە لە (صحیح)ی "موسلیم"دا هاتووە، لە کتێبی (الفتن والملاحم).

عن أنس بن مالك رضي اللّه عنه : أن رسول اللّه (ﷺ) قال: (يتبع الدجال من يهود أصبهان سبعون ألفا، عليهم الطيالسة).

عن أنس بن مالك قال قال رسول اللّه ﷺ : (يخرج الدجال من يهودية أصبهان، معه سبعون ألفا من اليهود ، عليهم السيجان)[1].

واتە شوێنی "دەجال" دەکەون هەفتا هەزار جولەکەی "ئەصفەهان" کەوا عەبایان لەبەردایە یان جببە لە هەندێک ڕیوایەتی تردا بەچەندەها شێوەی تر

١ رواه أحمد (٥٥/٢١) وحسنه المحققون في طبعة مؤسسة الرسالة.



هاتووە. کەواتە یەکەم قەوم و گەل جولەکەن ئایا پێتان سەیر نیە جوولەکە چی دەکات لە ئێران[1]؟!

ئنجا دواتر گەلانی تری وەک چین و ڕووس و تورک و ڕووی تێدەکەن، والله أعلم چونکە دەموچاویان ئاوا وەسف کراوە.

**دووەم: لەڕووی شوێنەوە:**

یەکەم شوێن (دەججال) لێوەی دەردەچێت زەوییەکە پێی دەڵێن (خۆراسان) و هەمووما دەزانین ئێرانە واتە یەکەم هەنگاوی (دەججال) لە ئێرانەوە لە خراسانە و شوێنکەوتەکانی لەسەرەتادا یهودی (ئەسفهانن).

عن أبي بكر الصديق رضي الله عنه قال : حدثنا رسول الله ﷺ قال : (الدجال يخرج من أرض بالمشرق يقال لها خراسان ، يتبعه أقوام كأن وجوههم المجان المطرقة)[2].

واتە شێوەی ئەوانەی دوایی دەکەون وەکو قەڵغانی ڕووپۆشکراو وایە. لە هەندێک ڕیوایەتدا (حمر وجوە)ە، واتە دەموچاویان سوورە کە ئەمەش دەلالەتە لەوەی ناوچەکە بەدەوروبەریەوە وەک چین و مەنگۆلی تورک وان، والله اعلم.

وعن عائشة رضي الله عنها أن النبي ﷺ قال: (وإنه يخرج في يهودية أصبهان)[3].

١ **تەنیا بۆ ڕوونکردنەوە:** ئێران واتە حوکمی جولەکە یەکەم دامەزرێنەری و بڵاوکردنەوەی فکری ڕەفزی ڕافزی شیعەگەری لەلایەن کەسێکی جوولەکە بو بەناوی (عبدالله بن سبء)

٢ رواه الترمذي (٢٢٣٧) وقال : حديث حسن غريب ، وحسنه الألباني.

٣ رواه أحمد (١٥/٤١) وحسنه المحققون في طبعة مؤسسة الرسالة.



يقول الحافظ ابن كثير رحمه اللّه:

"يكون بدء ظهوره من أصبهان ، من حارة يقال لها : اليهودية " انتهى[١].

بەکورتی لەناو نێوەندی جولەکەنشیندا دەردەکەوێت!

دووەم لە فەرموودەیەکی تری صحیحی "موسلیم"دا هاتووە کەوا (خارج خله بين العراق والشام) ئەمە تەنیا یەکجار هاتووە.

عن النواس بن سمعان يرفعه: (إنه خارج خلة بين الشام والعراق، فعاث يمينا وعاث شمالا، يا عباد اللّه فاثبتوا)، والخلة ما بين البلدين، كما يقول النووي.

وەک لەزۆرترین فەرموودەدا هاتووە یەکەم شوێن "خۆراسانە" و دواتر ڕوو لەشوێنەکانی تر دەردەکەوێت والله اعلم، سەر ڕێگای کوردستانیش دەبێت. لەوانەشە لێرەوە ئامادەکاری بۆ بکرێت ئاگاداربن "دەجال" هەموو زەوی دەکات جگە لە "مەککە" و "مەدینە" والله تعالى اعلم.



## بەشی حەوتەم: کاتی دەرچوونی "دەجال".

لەم بەشەدا پووختەی ئەو فەرموودانە باسدەکەین کەوا چی کاتێک دەجال دەرەچێت. دەجال دوای هاتنی ئیمام مەهدی علیه سلام دەرەچێت و لەزۆرینەی ئەو فەرموودانەی کە هاتوون لەسەر مەهدی حوکمەکەیان بە حەوت تــاوەکو نۆ

١ النهاية" (ص/٥٩)



ساڵ داناوە واتە گەر حەوت ساڵ یان نۆ ساڵ بێت لە کۆتا حوکمی مەهدی دەجال دەرەچێت، ئەویش بەپێی ئەم فەرموودانە:

١- **صحیح مسلم كتاب( الفتن واشراط ساعه).**

ئەمە بەشێکە لە فەرموودەکە چونکە درێژە:

فبينما هم كذلك إذ سمعوا ببأس هو أكبر من ذلك، فجاءهم الصريخ: إن الدجال قد خلفهم في ذراريهم، فيرفضون ما في أيديهم ويقبلون، فيبعثون عشرة فوارس طليعة. قال رسول الله (ﷺ): (إني لأعرف أسماءهم وأسماء آبائهم وألوان خيولهم، هم خير فوارس على ظهر الأرض يومئذ. أو: من خير فوارس على ظهر الأرض يومئذ).

لەکاتێکدا ئەمان لەم حاڵە دەبن گوێیان لێدەبێت کە بەڵایەکی لەوە گەورەتر لە دامێنیان گیر بووە. کاتێک جاڕچی دێتە لایان و هاواری لێدەکات: دەجال لە دوای خۆیان بەربۆتە ناو ماڵ و منداڵیانەوە. ئەوانیش چییان پێیە هەر هەمووی فڕێ دەدەن و ڕوو دەکەنەوە ماڵەوە، دە سوار چاک لە پێش خۆیانەوەدەنێرن. پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرمووێت: من زۆرچاک ناوی خۆیان و باوکیان و ڕەنگ و شێوەی ئەسپەکانیان دەزانم، ئەوان لە ڕۆژەدا چاکترین سواری سەر زەوی، یان لەو ڕۆژەدا لە چاکترین سواری سەر زەوین.

ئەم فەرموودەیە باس لە شەڕی موسڵمانان دەکات لەگەڵ ڕۆمدا. واتە کۆتا شەڕی ئەهلی ئیسلام بەسەرکردایەتی مەهدی علیه سلام دوای فەتحکردن ئنجا دەرەچێت.



٢- **صحيح مسلم كتاب (الفتن واشراط ساعه).**

عن أبي هريرة (رضي اللّه عنه): أن النبي (ﷺ) قال: (سمعتم بمدينة جانب منها في البر وجانب منها في البحر). قالوا: نعم يا رسول اللّه. قال: (لا تقوم الساعة حتى يغزوها سبعون ألفا من بني إسحق، فإذا جاءوها نزلوا فلم يقاتلوا بسلاح ولم يرموا بسهم، قالوا: لا إله إلا اللّه واللّه أكبر، فيسقط أحد جانبيها -قال ثور: لا أعلمه إلا قال- الذي في البحر، ثم يقولوا الثانية: لا إله إلا اللّه واللّه أكبر، فيسقط جانبها الآخر، ثم يقولوا الثالثة: لا إله إلا اللّه واللّه أكبر، فيفرج لهم، فيدخلوها فيغنموا، فبينما هم يقتسمون المغانم، إذ جاءهم الصريخ فقال: إن الدجال قد خرج، فيتركون كل شيء ويرجعون).

ئەبو هورەیرە (خوای لێ ڕازی بێت) دەڵێت: پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: ئەو شارەتان بیستووە کە لایەکی وشکانی و لایەکی لە دەریادایە. ووتیان: بەڵێ ئەی پێغەمبەری خوا، فەرمووی: قیامەت هەڵناستێت تاوەکو حەفتا هەزار کەس لەنەوەی "ئیسحاق" لەشکرکێشی بۆ دەکەن، کاتێک کە بۆی دێن دادەبەزن نە بەچەک جەنگ دەکەن و نە تیر دەتەقێنن، بەڵکو دەڵێن: لا اله الا اللّه و اللّه اکبر، لایەکی تر دەگرێت. (ثور) دەڵێت: من وا دەزانم کە فەرمووی ئەو لایەی کە لە دەریادایە. پاشان دووبارە دەلێن: لا اله الا اللّه و اللّه اکیر، ئەو لاکەی تریشی دەگیرێت، پاشان دووبارە بۆ جاری سێهەم دەڵێن: لا اله الا اللّه و اللّه اکبر، ڕێگەیان بۆ چۆڵ دەکرێت دەچنە ناویەوە دەکەونە کۆکردنەوەی دەستکەوت لە کاتێکدا کە خەریکی دابەشکردنی دەستکەوتەکان دەبن، هاوارێکیان پێدەگات و دەڵێت: دەجاڵ دەرچوو، ئیتر هەموو شتێک وازلێدێنن و دەگەڕێنەوە.

ئەم فەرموودەش هەر باس لە دوا شەڕ دەکات دوای ڕزگارکردنی "قوستەنتینیە". ئنجا دواتر دەجال دەرەچێت.

٣- **صحيح مسلم كتاب (الفتن واشــراط ساعة).**

عن جابر بن سمرة: (تغزون جزيرة العرب فيفتحها اللّه (عزة وجل)، ثم فارس فيفتحها اللّه (عزة وجل)، ثم تغزون الروم فيفتحها اللّه (عزة وجل)، ثم تغزون الدجال فيفتحه اللّه). قال: فقال نافع: يا جابر، لا نرى الدجال يخرج حتى تفتح الروم.

واتە دوای فەتحی جەزیرەی عەرەبی و فارس و ڕۆم فتح دەکەن و لەدوای فەتحی ڕۆم ئنجا دەجال دێت. سەرجەم فەرموودەکان کۆکن لەسەر دەرچوونی دوای کۆتا شەڕی مەهدی علیە سلام لەگەڵ ڕۆمدا ئنجا دێت. کەواتە هاتنی مەهدی دەجالی بەدوادا دێت، هاتنی دەجالیش واتە هاتنی گەورەترین فیتنەی سەر زەوی لە ئادەمەوە هەتا خاتەم. جا ئەگەر مەهدی حوکمی حەوت بێت یان نۆ ساڵ بێت لە کۆتا حوکمی دەرەچێت ئنجا شەش بێت یان حەوت یان کەمتر یان زیاتر الله دەیزانێت.



# بەشی هەشتەم: یەکەم بانگەوازی "دەجال".

## قـۆناغی مەترسیدار!

لەم بەشەدا باسی دوای دەرچوونی دەکەین، بەڵام شتێک لێرەدا هەیە کەوا زۆرینەمان لێی بێ ئاگاین و جیامان نەکردووەتەوە، ئەویش دەرکەوتنی دەجالە کەوا بە سێ قۆناغە. واتە گەورەترین قۆناغ و مەترسیدارینیان ئەوەیە کە دەڵێت من خوام، بەڵام لەو هەستیارتر دوو قۆناغی پێشووترە کەوا زووتر دەردەچێت. بەڵام زۆرینە هەستی پێناکەن کە سێ قۆناغە واتە دەرچوونی یان دوای دەرچوونی بە سێ قۆناغ کارەکانی خۆی دەکاتن. زۆر بەووردی و بەزیرەکی و لێهاتوویی و لەسەرخۆییە. بۆیە رسول الله پێمان دەفەرموویێت لە سەرەتای خلقی ئادەم تاوەکو خاتەم هیچ فیتنەیەک ئاوا گەورە نەبووە و ناشبێت.

قۆناغی بانگەواز و دەر چوونی دەجال زانایان کردوویانە بە سێ قۆناغ واتە زۆرینەی زانایان کۆکن واتە یەک دەنگن لەسەر ئەوەی دەجال بە سێ قۆناغ بانگەواز دەکاتن.

**<u>یەکەم: قۆناغی پیاوچاکی و چاکخوازی.</u>**

قال ابن الحجر في فتح الباري: وأما الذي يدعيه فإنه يخرج أولا فيدعي الإيمان والصلاح ثم يدعي النبوة ثم يدعي الإلهية[١].



١ فتح الباري/ ص: ٩٨



زانای موحەدیث ئیبن حیجر ئەلعەسقلانی لە (فتح الباری) شەرحی صەحیح "بوخاری"دا دەڵێت یەکەم شت کە دەجال بانگەوازی بۆ دەکاتن ئیمان و چاک خوازی یە، ئنجا پێغەمبەرایەتی، ئنجا خوایەتییە.

هەروەها ئیبن عوثەیمین دەڵێت،

سئل الشيخ العثيمين هذا السؤال : ما هي دعوة الدجال وما يدعو إليه؟

ذكر أنه أول ما يخرج يدعو إلى الإسلام ويقول: إنه مسلم، وينافح عن الإسلام، ثم بعد ذلك يدعي النبوة وأنه نبي، ثم بعد ذلك يدعي أنه إله! فهذه دعوته نهايتها بداية فرعون وهي ادعاء الربوبية.

واتە پرسیاری بانگەوازی دەجالیان لێکردووە، دەڵێت: یەکەم بانگەواز بۆ ئیسلامەتییە و دەڵێت من موسڵمانم و ئنجا بانگەوازی نبوەت (پێغەمبەرایەتی) و ئنجا خوایەتییە کە کۆتایەتییەتی، هەروەک چۆن فیرعەون بانگەوازی خوایەتی کرد.

بەڵێ مەترسیەکە لێرەدایە بۆیە زانایان دەڵێن لەسەرەتا خەڵکێکی زۆر لە عەوام جـاهیل لە موسڵمانەکەش و بە یەهود و گاورەوە شوێنی دەکەون دەزانن بـۆچی؟ چونکە لەسەرەتادا وەک مرۆڤێکی ئاسایی و بێ عەیبە، واتە ئەو عەیبانەی وەک کوێری و کوفری نێوچەوانی و چەندان شتی تر لێی بەدی ناکرێت یا الله پەنات پێ دەگرین لەو فیتنە مەترسیدارە.

لێرەدا شتێک هەیە ئەویش لەبەرئەوەی مەهدی علیه سلام دەرچووە لەسەرەتای دەرچوونیەتی، بۆیە یەکەم دژایەتی دەججال بە نیفاقی دژایەتی ئیمام مەهدیە و عەوام و جاهیلە موسڵمانێکی زۆر زۆریش شوێن ئەم بانگەوازەی دەکەون.

**قۆناغی دووەم: بانگەوازی پێغەمبەراتی.**

دوای قۆناغی پیاوچاکی و دوای ئەوەی خەڵکێکی زۆر بڕوا و متمانەی پێدەکەن و دوای ناسراوی، ئنجا زۆر بە زیرەکی بانگەوازی پێغەمبەراتی دەکات دەڵێت من پێغەمبەرم.

خطبنا رسول اللّٰه فكان أكثر خطبته يحدثنا عن الدجال و يحذرناه و إنه يبدأ فيقول : (أنا نبي و لا نبي بعدي ثميثني فيقول : أنا ربكم و لن تروا ربكم حتى تموتوا و إنه أعور و إن ربكم ليس بأعور)[1].

واتە رسول اللە صلی اللّٰه علیه وسلم ووتاری بۆ دەداین و زۆرترینی ووتارەکەی لەسەر دەججال بوو و لە مەترسیەکانی ئاگاداری دەکردین و دەیفەرموو: سەرەتا دەڵێت پێغەمبەرم، بەڵام هیچ پێغەمبەرێک لە دوام نییە و دەڵێت من خوام و ئێوە هەرگیز اللە تان نابینن تەنها دوای مردن نەبێت و ئەو کوێرە لاچاوە، بەڵام خوای ئێوە واتە اللە وانیە.

بەڵێ لەم قۆناغەش دەڵێت پێغەمبەرم. بەڵێ هەندێک لە زانایان دەڵێن، ناڵێت پێغەمبەری ئیسلامم چونکە ئەگەر ئاوابڵێت یەهود و گاور و موسڵمانەکەش، واتە

١ الراوي: أبو أمامة الباهلي المحدث: الألباني - المصدر: تخريج كتاب السنة - الصفحة أو الرقم: ٤٢٩ خلاصة حكم المحدث: صحيح.



بەناو جاهیلە موسڵمانەکەش شوێنی ناکەون، چونکە دەزانرێت کە دوا پێغەمبەر نێردراوە بەڵکو وەک عیسا علیە سلام خۆی دەرەخات واللە أعلم.

**قۆناغی سێیەم: بانگەوازی خوایەتی.**

کەوا لە سەرەتادا ناڵێت خوام و تا دەرچوونی گەورەش واتە قۆناغی سێیەم لەوانەیە لەگەڵ دەرچوونی مەهدی ئەویش دەربچێت و بانگەوازی خۆی بکات. چونکە گومانتان لەوە نەبێت هەزاران ساڵە وجودی هەیە بەڵام فیتنە گەورەکەی بۆ کۆتا زەمان دانراوە، بۆیە دەبێت زۆر ووریابین. لەم قۆناغەش زانایان دەڵێن: مرۆڤی ئاساییە تا پێش ئەم قۆناغەش، بەڵام دوای ئەوەی دەڵێت من خوام. ئنجا شێوەی دەگۆڕێت واتە دەبێتە (أعور العين) و نێوچاوانی دەنوسرێت کوفر قاچەکانی تێک دەچن. لێرەدا ئەوەی موسڵمانە و عەوامە کەمێک ئیمانی هەبێت هەست پێ دەکاتن ئەوانی تر لە مونافیق و گاور و جولەکەش هەموو شوێنی دەکەون وەک لەفەرمووده، لە (صحیح)ی "موسلیم" و "بوخاری"دا هاتووە خەڵکی لە دەست "دەجحال" ڕادەکەن بەرەو چیاکان.

بۆیە دەبێت ئەو بیرکردنەوە وازلێبهێنن بڵێن دەجال لەناکاو دەرەچێت، بەڵکو لەگەڵ دەرچوونی مەهدی دەردەچێت، بەڵام دوا قۆناغی لەگەڵ کۆتایی هاتنی حوکمی مەهدیە واتە دوای فەتحی ڕۆم ئنجا دەرچوونی گەورەی دەججالە.



## بەشی نۆیەم: پێش كۆتا قۆناغی دەرچوونی "دەجال" چۆنە؟

لەم بەشەدا پشتیوان بە الله بۆ زیاتر بەرچاو ڕوونی باسی پێش دەرچوونی دەجال دەكەین. بەڵام لێرەدا شتێک هەیە ئەویش پێش دەرچوونی كۆتا قۆناغە واتە دەبێت ئەوە بزانن لەوانەیە دەجال لە قۆناغی یەكەم و دووەم لەگەڵ هاتنی مەهدی ڕاستەوخۆ بێتن، كە پێشتر ئاماژەم پێكردووە لە قۆناغی یەكەم و دووەم زووتر دەرەچێت. واتە هێشتا نەناسراوە بەڵام لە مەرحلەی پێش كۆتاییە ئەوەیە مەترسیەكە. بۆیە دەڵێم مەترسی و ترسناک چونكە زۆرینەی موسڵمانە عەوامە و نەزانەكەش بە نەزانی شوێنی دەكەون. الله بمان پارێزێ، پێش دەرچوونی كۆتا قۆناغ.

لەسەردەمی مەهدی علیه سلام دەركەوتووە موسڵمانان لەگەڵ ڕۆمدا لە شەڕدان بەبەڵگەی چەند فەرموودەیەک. بەڵام هەندێکی لاوازن بۆیە تەنیا ئەوە بەسە تابزانین چۆنە.

ففي سنن ابن ماجه، وصحيح ابن خزيمة ، ومستدرك الحاكم ، عن أبي أمامة أن النبي (ﷺ) قال: (إن قبل خروج الدجال ثلاث سنوات شداد، يصيب الناس فيها جوع شديد، يأمر اللّه السماء في السنة الأولى أن تحبس ثلث مطرها، ويأمر الأرض أن تحبس ثلث نباتها، ثم يأمر السماء في السنة الثانية فتحبس ثلثي مطرها، ويأمر الأرض فتحبس ثلثي نباتها، ثم يأمر السماء في السنة الثالثة فتحبس مطرها كله، فلا تقطر قطرة، ويأمر الأرض فتحبس نباتها كله، فلا تنبت خضراء، فلا يبقى

ذات ظلف إلا هلكت؛ إلا ما شاء اللّه ، قيل: فما يعيش الناس في ذلك الزمان؟ قال: التهليل والتكبير، والتحميد، ويجزئ ذلك عليهم مجزأة الطعام)[1].

واتە پێش دەججال سێ ساڵی زۆر قورس و گرانی هەن کەوا خەڵک تووشی برسییەتی زۆر قورس دەبن. الله فەرمان بە ئاسمان دەکات لە ساڵی یەکەم کەوا سێیەکی بارانی بگرێتەوە، هەروەها فەرمان بە زەوی دەکاتن سێیەکی گژوگیا و دانەوێڵەی بگرێتەوە و لە ساڵی دووەم فەرمان بە ئاسمان دەکات نیوەی بگرێتەوە، ئنجا زەویش نیوەی دانەوێڵە و گژووگیا بگرێتەوە، ئنجا لە ساڵی سێیەم فەرمان دەکاتن بە ئاسمان هەمووی بگرێتەوە تەنانەت یەک قەترە باران نەبارێت و زەویش هەموو دانەوێڵە و گژوگیا بگرێتەوە یەک شت شین نەبێت و هەمووی لەناو دەچن. (واتە بەمەش دەبێتە ووشکە ساڵێەکی تەواو و زۆر قورس). ووترا خەڵک چۆن ژیان دەکەن لەم کاتەدا. فەرمووی: بە سبحان الله و الحمد الله و الله اكبر ئەمانە جێگای خواردنیان بۆ دەگرێتەوە.

کەواتە پێش دەرچوونی کۆتا قۆناغ واتە بانگەوازی خوایەتی ئەوا موسڵمانان بەم قۆناغ و حاڵە سەخت و دژوار و نارِەحەتی و ناهەموارەوە گوزەردەکەن. بۆیە دەفەرموویێت: (أعظم فتنة)، واتە گەورەترین و سەخترین تاقیکردنەوە لەسەرەتای خەڵق لە ئادەم عليه سلام تاوەکو خاتەم. ئنجا دڵنیابن ڕزگاربوون لەفیتنەی "دەججال" پێویستی بەئیمانی پتەو و عەقیدەیەکی پاک و بێگەرد هەیە. بۆیە خەڵکینە تکاتان لێدەکەم خۆتان و ماڵ و منداڵتان لەم فیتنە بپارێزن فێریان بکەن

---

١ صححه الألباني في صحيح الجامع



ئەم وانانەیان بۆ بڵێنەوە لەگەڵ کەس و کارتان و ماڵ و منداڵ و خێزانتان فێریان بکەن پێیان بڵێن بڕوابکەن زۆر نزیکین لە ساتی دەرچوونی.



## بەشی دەیەم: بۆچی "دەجال" ترسناکە؟!

لەم بەشەشدا تیشک دەخەینە سەر مەترسیداری "دەججال" واتە هـۆکاری مەترسیدارییەکەی وە یان کاتێک دەر دەکەوێت چی پێیە و خـەڵک بۆچی بەشوێنی دەکەون؟

"کتاب الفتن" صحیح بخاری:

عن حذیفة ، عن النبي ﷺ قال في الدجال: (إن معه ماء ونارا، فناره ماء بارد، وماؤه نار).

واتە رسول الله ﷺ فەرموویەتی لەسەر دەججال کەوا ئاو و ئـاگری پێیە ئاگرەکەی ئاوێکی سـارد و سـازگارە و ئـاوەکەی ئـاگرە.

لە (صحیحین)ی "بوخاری" و "موسلیم"دا هاتووە:

حدثني قیس ، قال : قال لي المغیرة بن شعبة : ما سأل أحد النبي ﷺ عن الدجال ما سألته، وإنه قال لي : (ما يضرك منه ؟ قلت : لأنهم يقولون : إن معه جبل خبز ونهر ماء. قال : هو أهون على الله من ذلك).



واتە "مغیرە" الله لێی ڕازیبێت دەڵێت: کەس هێندەی من پرسیاری دەربارەی دەججال نەکردووە و ئەو پێی ووتم مەترسە زیانت پێناگەیەنێت. منیش ووتم دەڵێن ئەو چیایەک نان و ڕووباری ئاوی لەگەڵە و پێیە. پێی ووتم: ئەو زۆر بچوکتر و کەمترە لای الله تعالی لەمە.

یان لە (مسند أحمد) و (سنن أبی داود) هاتووە بەهەمان شێوەی بوخاری و موسلیم بەڵام هەندێکی بۆزیادکراوە وەک:

عن حذيفة بن اليمان ، قال : قال رسول اللّه ﷺ : (لأنا أعلم بما مع الدجال من الدجال، معه نهران يجريان، أحدهما رأي العين ماء أبيض، والآخر رأي العين نار تأجج، فإما أدركن أحدا منكم فليأت النهر الذي يراه نارا، وليغمض ثم ليطأطئ رأسه، فليشرب، فإنه ماء بارد، وإن الدجال ممسوح العين اليسرى، عليها ظفرة غليظة. وفيه : مكتوب بين عينيه كافر، يقرؤه كل مؤمن، كاتب وغير كاتب).

واتە من ئەزانم دەججال چی پێیە چەند ڕوبارێک واتە لە یەک زیاترە. لەم لەفزە ئاوا هاتووە کەوا یەکێکیان چاو بە ئاوێکی سپی سازگار دێتە پێش چاو واتە ئاوە ئەوەیتریان ئاگرە. هەریەک لە ئێوە گەر پێی گەیشت لەو ڕۆژە بابچێتە ئەو ڕوبارەی کە پێی وایە ئاگرە و چاوی دابخات و سەری ببات لێی بخواتەوە چونکە ئاوێکی ساردە ئنجا دێتە سەر وەسفی دەججال کە پێشتر باسم کردووە.

پووختەی ئەم فـــەرمووودانە لەبەشی پێشوودا باسم کردووە کەوا پێش دەججال چەند ساڵێک ووشکە ساڵی زۆر سەخت دەبێت. ئنجا لەو کاتەدا دەردەچێت کە دەڵێن بەهەشت و جەهەنەمی پێیە یان ئاو و نان یان ئاگر و ئاو. ئەمانە واتای

ئەوەیە دەججال بە خەڵک دەڵێت شوێنم بکەون نان و ئاو و ژیانتان پێدەدەم ئەگەرنا لە برساندا دەمرن. لە فەرموودەدا هاتووە کە بەلای گوندێک دەڕوات بڕوای پێ دەهێنن. ئنجا فەرمان بە هەور دەکات ببارێنێت و بە زەویش بڕوێنێت، دواتر بەلای گوندێکی تردا تێدەپەڕێت بڕوای پێناهێنن فەرمان بە زەوی دەکات وشکی بکات یەک قەترە نەبارێت. لە فەرموودەدا هاتووە ئەو خەڵکەی لە دەست "دەججال" ڕادەکەن و بڕوای پێ ناهێنن خواردنیان (تهليل و تكبير و تحميده) واتە لا إله إلا اللّه و اللّه أكبر و الحمدالله یە.

بەپووختتر و ڕوونتر چۆن ئێستا خەڵک لەپێناو پارە و نان و ئاو ئامادەن دینیان بفرۆشن و ببنە خزمەتکاری تاغوت و کۆیلەیان، بەهەمان شێوەش بۆ دەججال هەروایە. ئێستا چۆنە ئەوکاتەش هەروا دەبێت چـونکە ئێستا زۆرینە هەمان سیاسەتی دەججالی (كذاب) بەکاردەهێنن.



## بەشی یانزەیەم: چییکەین تا پارێزراوبین لە "دەججال".

دوای باسکردنی قۆناغەکانی پێش هاتنی "دەججال" و دوای هاتنی پێویستە بزانین چۆن و بە چی ڕێگایەک خۆمان بپارێزین لەم فیتنە زۆر گەورەیەی ڕوبەڕووی زەوی و مرۆڤایەتی دەبێتەوە. الحمدالله لە گەورەیی ئەم دینە بەتایبەت ئێمەی ئوممەتی کۆتا زەمان چونکە دەججال لەسەر ئەم گەلە دەردەچێت و دونیا هەر لەسەر ئەم ئوومەتە کۆتایی دێت. دوای ئەوەی بۆمان ڕوونکراوەتەوە کە



دەججال چیه و کێیه و له کوێیه و کەی دێت و چی پێیه، هەروەها بۆشمان دیاریکراوه چۆن خۆمان بپارێزین لێی. من بەکورتی ئاماژه دەدەم به ڕێگاکانی ڕزگاربوون لێی.

١- **شوێنکەوتنی مەهدی:**

یەکێک لەڕێگاکانی سەلامەت بوونی ئیماندار له دەست "دەججال" ئەوەیه شوێن "مەهدی" علیه سلام بکەوێت. کاتێک دەردەچێت لەبەرئەوەی مەهدی پەیامی حەقی پێیه و شوێن نەکەوتن واتای دان نەنان به حەق دەگەیەنێت. بەمەش (إلا من رحم ربي) گەرنا زۆر ئەستەمه پارێزراو بیت لەفیتنەی "دەججال". رسول الله ﷺ فەرمانی پێکردووین خۆمانی بگەیەنەتێ گەر به چنگەخشکێش بەسەر بەفریش بووبێت. بۆیه بۆ خۆپارێزی خۆت و ئیمانت دەبێت شوێن مەهدی علیه سلام بکەویت گەرنا.

٢- **ڕاکردن لێی:**

ڕاکردن بەرەو شاخ و چیاکان له دەست "دەججال". ئەمه یەکێکه له ڕێگاکانی خۆ پاراستن له دەججال کەوا خەڵک واته ئیماندار نەک هەموو خەڵک، چونکه تەنها ئیمانداره دەیناسێت و شوێنی ناکەوێت گەرنا زۆرینەی خەڵک شوێنی دەکەون بڕوای پێ دەهێنن.

عن أم شريك (رضي الله عنها): أنها سمعت النبي (ﷺ) يقول: (ليفرن الناس من الدجال في الجبال. قالت أم شريك: يا رسول الله، فأين العرب يومئذ؟ قال: هم قليل).



دایکی شریک (خوای لێ ڕازی بێت) دەڵێت: لە پێغەمبەری خوام (ﷺ) بیست دەیفەرموو: خەڵکی لە دەججال هەڵدێن بەرەو کێوەکان.

دایکی شریک وتی: عەرەب لە کوێ دەبن ئەو ڕۆژە ئەی پێغەمبەری خوا؟

فەرمووی: (ئەوان کەمن).

### ٣- کۆچکردن بۆ "مەککە" و "مەدینە":

یەکێکی دی لە ڕێگاکانی ڕزگاربوونی ئیماندار و زیاتر منداڵ و خێزانی ئیماندار دەگرێتەوە چونکە ئەوکاتە پیاوەکان لە جیهادن و لە فەرموودەش داهاتووە، "موسلیم" تەخریجی کردووە کاتێک دەججال دەردەچێت موسڵمانان خەریکی فەتحی "قوستەنتینیەن". ئنجا بانگ دەرێک جاڕ دەدات دەججال دەرچووە لەنێو خێزان و منداڵتان دایە.

هەروەها لە چەندان فەرموودەی (متفق علیه)دا، واتە "بوخاری" و "موسلیم" دا هەردووکیان هێناویانە. ئیمام بوخاری لە کتێبی (الفتن)ەوە و ئیمام موسلیم لە کتێبی (فتن واشراط ساعة)ەوە هێناویانە کە :

عن أبي بكرة، عن النبي ﷺ قال : (لا يدخل المدينة رعب المسيح الدجال).

واتە مەترسی دەججال ناچێتە نێو مەدینەوە یان بەمشێوەیەش:

عن أبي هريرة قال : قال رسول الله ﷺ : (على أنقاب المدينة ملائكة، لا يدخلها الطاعون ولا الدجال).

واتە مەلائیکەت لەسەر بەرزاییەکان پارێزگاری لێ دەکەن یان:



فاطمة بنت قيس عن رسول الله (ﷺ) عن تميم الداري (رضي الله عنه) أن الدجال قال له: (فأخرج فأسير في الأرض فلا أدع قرية إلا هبطتها في أربعين ليلة غير مكة وطيبة فهما محرمتان علي كلتاهما) رواه مسلم.

واته دوای دەرچوونی بە زەویدا دەگەڕێت هیچ شار و گوندێک نامێنێت هەر دەچێتە ناوی لەماوەی ٤٠ ڕۆژەکەی بۆی دانراوە تەنیا مەککە و (طيبة) مەدینە نەبێت.

فەرموودە زۆرن لەسەر ئەم بابەتە، بەڵام ئەوەندە بەسە. هەروەها هەندێک چارەسەری تریش هەیە وەک خوێندنی ١٠ ئایەتی سەرەتای سورەتی (الكهف). بەڵام بە تەدەبوور (تێڕامان)ەوە بخوێنرێت. ئەمەش وا ئاسان نییە بڵێن والله دەججال بێت تەنها ئەوە دەکەم تەواو، سێ ڕێگاکەی سەرەوە زۆر بەهێزترن.



## بەشی دوانزەیەم: ئایا دژی "دەججال" بجەنگین؟

لەم بەشەدا تیشک دەخەینە سەر ئـەوەی چی بکەین کە "دەججال" هات ئایا ڕووبـەڕووی ببینەوە و بجەنگین؟

(من سمع بالدجال فلينأ عنه، فوالله إن الرجل ليأتيه وهو يحسب أنه مؤمن فيتبعه مما يبعث به من الشبهات)[1].

---

١ رواه أبو داود



ئەمە فەرموودەیەکە لەبـارەی دەججالەوە کەوا رسول الله ﷺ پێمان دەڵێت: هەرکاتێک گوێتان لێبوو دەججال دەرچوو خۆتانی لێ بپارێزن و لێی دووربگرن واباشترە. لەبەرئەوەی  دەفەرموویت سوێند بە الله پیاو دەچێـتە لای بەحساب ئیمانداریشە تا بچێت ڕووبەڕووی ببێتەوە، کەچی ئیمانی پێدێنێت و شوێنی دەکەوێت. لەبەر ئەو هەموو شبهات (گومان) و فێڵەی پێی نیشان دەدات. کەواتە باشترین کار بۆ ئیماندار ئەوەیە لەبەشەکانی پێشودا بـاسمان کردووە، بریتییە لە خۆپارێزی و ڕاکردن لێی. نەچێت بچێت بڵێت ڕووبەڕووی دەبمەوە چونکە ناتوانرێت الله هێزی زۆری پێداوە.

تەنها دوو کەس ڕووبەڕووی دەبنەوە. لەچەندین فەرموودەدا هاتووە کە یەکێکیان گەنجێکە، کەوا رسول الله دەفەرمووێت: بۆی دەرەچێت کە ئەم کەسەش لەباشترینەکان و هەڵبژێردراوانی زەویە لەم کاتەدا. دەچێت پێی دەڵێت تۆ دەججالی کوێری بەو سیفەت و ڕوونکردنەوانەی کەوا رسول الله ﷺ پێی وتووین.

- دەججالیش بە دەورووبەری دەڵێت: ئایا گەر ئەمە  بکوژم و زیندوویی بکەمەوە بڕوام پێدەکەن زیاتر.

- ئەوانیش دەڵێن: بەڵێ.

ئنجا شەقی دەکات و لەناو هەردوو پارچەی هاتووچۆ دەکات و پێی دەڵێت چاک ببەوە. دووبارە کە زیندووی دەکاتەوە، هەمان قسەی پێدەڵێت بەوەی تۆ دەججالی کوێرێت، الخ. ئنجا دەججال دەیگرێت و فڕێی دەداتە نێو ئاگر دەفەرمووێت ئەوە بەهەشتێکە.

ئەمە پووختەی فەرموودەیە. هەروەها دووەمیان عیسا علیه سلام کەوا دەیکوژێت.



## بەشی سیانزەیەم: مانەوەی "دەجال" لەسەر زەوی.

دوای باسی زۆربەی بەشە پێویستەکان خاڵ بەخاڵ و بەشێوەی ڕیزبەندی و بەدوای یەک، بەکورتی ئاماژە بەوە دەکەم مانەوەی دەجال چەندە. یەکێک لەو فەضلانەی الله لەگەڵ ئێمەی کردووە، ئەوەیە کەوا ماوەی مانەوەی "دەجال"ی کوێر زۆر کەمە الحمدالله رب العالمین. گەر بێت لە کاتی دەرچوونی ماوەیەکی زۆر بمایاتەوە، ئەوا زۆر ئەستەم دەبوو دەرچوون لەو فیتنەیە، گەر بەئیمانیشەوەبیت.

جاء في الحديث (أنه يمكث في الأرض أربعين صباحا)[1].

واتە دەجال لەسەر زەوی دەمێنێتەوە بۆماوەی چل بەیان.

بەڵام نەوەک ڕۆژی ئاسایی بێت. ئنجا لە فەرموودەیەکی تر کەوا ئیمامی "موسلیم" هێناویەتی.

فقد سأل الصحابة النبي عن مدة لبث الدجال ؟ فقال: (أربعين يوما، يوم كسنة، ويوم كشهر، ويوم كجمعة، وسائر أيامه كأيامكم . قلنا: يا رسول الله أرأيت اليوم

١ قال الهيثمي في المجمع: "رواه أحمد ورجاله رجال الصحيح.



الذي كالسنة أتكفينا فيه صلاة يوم ؟ قال: لا، ولكن اقدروا له . قلنا: يا رسول اللّٰه فما سرعته في الأرض ؟ قال كالغيث استدبرته الريح)[1].

واتە پرسیار کرا لەسەر دەججال لەلایەن هاوەڵان لەسەر کاتی مانەوەی؟ فەرمووی: چل ڕۆژە، ڕۆژێکیان وەک یەک ساڵە و یەکێکیان وەک یەک مانگە و، هەروەها ڕۆژێکیش بەقەدەر یەک هەفتەیە و باقی ڕۆژەکانی تر وەک ڕۆژی ئاسایی وایە. هەروەها پرسیمان باشە لەو ڕۆژەی وەک یەک ساڵە نوێژەکانمان چۆنە و چەندە؟ واتە وەک نوێژی یەک ڕۆژە. فەرمووی: نەخێر، بەڵکو بەقەدەر خۆی واتە (بەئەندازەی هەر ڕۆژێک ٥ فەرزەکەی تیا ئەنجام بدەن). ئنجا پێمان ووت، خێرایی چەندە و چۆنە لەسەر زەوی؟ فەرمووی: وەک بای بـاران وایە.

ئەمەش یەکێکە لەو نیعمەتانەی الله تعالی یە بۆمان. چونکە لەو ماوە کەمە زۆرینەی زۆری گۆمڕا دەکاتن و شوێنی دەکەون. جا ئەی ئەگەر زیاتر بوایە هاوار بەحاڵمان، إلا من رحمە گەرنا دەرچوون لێی ئەستەم بوو.



## بەشی چواردەیەم: ئایا دوای هاتنی "دەججال" تۆبە قبووڵە؟

دوای باسکردنی زۆرینەی بەشە پێویستەکان ئێستا بەرەو تەواوبوون دەچین. بۆیە باسی یەکێک لە بەشە ئاڵۆزەکان دەکەین. دەمەوێت زۆر بەپووختی و

---

١ رواه مسلم

بەووردی بۆ هەموو لایەک ڕوونی بکەمەوە کەوا کامەیان ڕاستە. چەند فـەرموودەیەکمان هەن کەوا بەمشێوەیەن:

**خاڵی یەکەم:**

عن أبي هريرة ، قال: قال رسول الله ﷺ: (ثلاث إذا خرجن لا ينفع نفسا إيمانها لم تكن آمنت من قبل ، أو كسبت في إيمانها خيرا: طلوع الشمس من مغربها، والدجال، ودابة الأرض)[1].

واتە سێ شت هەن گەر دەربچن ئەوا نفس هیچ سودێکی پێناگات، ئەگەر ئیمانیش بهێنێت گەربێت و پێشووتر ئیمانی نەهێنابێت. لەوانە هەڵاتنی خۆر لە خۆرئاوا و دەججال و دابە الارض.

ئەم فەرموودەیە ئەگەر بەزاهیریەن و ڕووکەش وەری بگرین ئەوا واتای وایە تۆبە قبووڵ نییە، بەڵام هێشتا ماوە.

(ثلاث إذا خرجن لم ينفع نفسا إيمانها لم تكن آمنت من قبل، أو كسبت في إيمانها خيرا: طلوع الشمس من مغربها، والدخان، ودابة الأرض)[2].

ئەمجارە هەمان واتای فەرموودەی سەرەوە، تەنیا ئەوە نەبێت لەم ڕیوایەتە دەججالی تێدانییە بەڵکو هەڵاتنی خۆر لە خۆرئاواوە و دخان واتە دووکەڵ و دابەی زەوی.

---

١ روى مسلم (١٥٨)

٢ الإمام أحمد (٩٧٥٢)



عن أبي هريرة أن رسول اللّٰه ﷺ قال: (بادروا بالأعمال ستا طلوع الشمس من مغربها أو الدخان أو الدجال أو الدابة أو خاصة أحدكم أو أمر العامة)[1].

واتە پەلە بکەن لە کرداری چاکە بەر لە شەش شت، خور لەخۆرئاوا و دوکەڵ و دەججال و دابەی زەوی ئەمری تایبەت و گشتی.

لەم فەرموودەش دەججالی تێدایە. بەڵام ڕاستەوخۆ ناڵێت گەر دەربچن تۆبە قبووڵ نییە.

## خاڵی دووەم:

ئەم فەرموودانە کەمێک ئاڵۆزن، بۆیە دەچینەوە خزمەت قورئان لە تەفسیری ئەم ئایەتە، قال الله تعالی: ﴿هَلْ يَنظُرُونَ إِلَّا أَن تَأْتِيَهُمُ الْمَلَائِكَةُ أَوْ يَأْتِيَ رَبُّكَ أَوْ يَأْتِيَ بَعْضُ آيَاتِ رَبِّكَ ۗ يَوْمَ يَأْتِي بَعْضُ آيَاتِ رَبِّكَ لَا يَنفَعُ نَفْسًا إِيمَانُهَا لَمْ تَكُنْ آمَنَتْ مِن قَبْلُ أَوْ كَسَبَتْ فِي إِيمَانِهَا خَيْرًا ۗ قُلِ انتَظِرُوا إِنَّا مُنتَظِرُونَ﴾[2].

لەبارەی ﴿أو يأتی بعض آيات ربك..﴾

١- **<u>لە تەفسیری "البغوی" دەڵێت:</u>**

واتای هەڵاتنی خۆرە لەخۆر ئاواوە ئەم کات تۆبە قبووڵ نابێت. بگەڕێینەوە سەر تفسیری البغوی.

---

١ مسلم في صحيحه (٢٩٤٧)

٢ سورة الأنعام: الآية ١٥٨



٢- **إبن كثير:**

لە تەفسیری هەمان ئایەت دەڵێت: ئەمەیان پێش قیامەتە.

وقال البخاري في تفسير هذه الآية:

حدثنا موسى بن إسماعيل، حدثنا عبد الواحد، حدثنا عمارة، حدثنا أبو زرعة، حدثنا أبو هريرة، رضي الله عنه، قال : قال رسول الله ﷺ : (لا تقوم الساعة حتى تطلع الشمس من مغربها، فإذا رآها الناس آمن من عليها. فذلك حين، لا ينفع نفسا إيمانها لم تكن آمنت من قبل).

واتە لە صحيح بخاری دا لە أبوهڕیرەوە قیامەت نایەت، تاوەکو خۆر لەخۆرئاواوە هەڵنەیەت و گەر خەڵک بینیان، ئەم کات ئیمان دەهێنن لەکاتێک سودیان پێناگات ئنجا ئایەتەکە.

٣- **قرطبی:**

بەهەمان شێوەی موفسیران دەڵێت: يوم يأتی بعض آيات ربك

هەڵاتنی خۆرە لە خۆرئاواوە.

٤- **إمام المفسرين طبری بەهەمان شێوە دەڵێت:**

هەڵاتنی خۆرە لەخۆرئاواوە، ئەم کات ئیمان هێنان هیچ سوودێک ناگەیەنێت. هەروەها ئەم فەرموودەش لەبارەی تفسیری ئەم ئایەتەیە:

عن أبي سعيد الخدري قال : قال رسول اللە ﷺ : (يوم يأتي بعض آيات ربك لا ينفع نفسا إيمانها. قال: طلوع الشمس من مغربها).

کەواتە لە خاڵی یەکەم تێگـەیشتن ئاڵۆز بوو چونکە فەرموودەی صحیح هەبوو، ئنجا لەخاڵی دووەم ئاسانتر بوو، بۆئەوەی بەیەکجاری هیچ گوومانێک نەمێنێت.

**خاڵی سێیەم:**

وعن معاوية رضي اللە عنه قال: قال رسول اللە ﷺ : (لا تنقطع الهجرة حتى تنقطع التوبة ، ولا تنقطع التوبة حتى تطلع الشمس من مغربها)[1].

واتە هیجرەتکردن ناپچڕێت و بەردەوام دەبێت تا تۆبە نەبچڕێت و کۆتایی نەیەت و تۆبەش کۆتایی نایات و ناپچڕێت تاوەکو خۆر لەخۆرئاواوە هەڵنەیەت.

لەکۆتاییدا الحمدالله کە توانیم ئەم گرێ کوێرە ئاڵۆزە بکەمەوە، لای زۆرێک ڕوون نەبوو بۆیە تا خۆر لە خۆرئاواوە هەڵنەیات تۆبە کۆتایی نایات.



## بەشی پانزەیەم: کوشتنی "دەجال" و کۆتایی فیتنەکەی.

لەگەڵ هەر سەرەتایەک هەنگاو بەرەو کۆتاییەکەی دەڕوات. سبحان الله، چی نیعمەتێکە لەگەڵ ئەم ئوممەتە کراوە. خاڵ بەخاڵ لەسەرەتاوە تاکو کۆتایی باسی هەموو فیتنەکانمان بۆ کراوە. یەکێک لەوانە دەجالە کەوا هەموو خاڵێک لەسەری

١ رواه أحمد، وأبو داود، والدارمي. فەرموودەیەکی صحیحە.



وورد و پووخت پێمان ووتراوە. ئەوەتا تەنانەت کات و شوێنی کوشتنیشمان بۆ ڕوونکراوەتەوە.

دوای دەرچوونی "دەجال" و گەڕان بەهەموو زەوی لە مشرق (خۆرهەڵات) تاوەکو مغرب (خۆرئاوا) و زۆرینەی زۆری خەڵک شوێنی کەوتوون. بەڵام الله تعالی ڕەحمی بە موسڵمانان کردووە بەوەی لە دەجالی قەدەغەکردووە بچێتە چەند شوێنێک کە وەک پەناگەی ئیماندارەکانە. ئەوانیش، مەککە و مەدینە و (بيت المقدس)ە، دەجال و شوێنکەوتوانی دەجال کە پێشتر باسمان کردوون کێن؟

موسڵمانانیان گەمارۆداوە لە هەموو لایەکەوە، تەنیا ئەوە نەبێت مەلائیکەتەکان لەهەموو بەرزاییەکانەوە پاسەوانی تووند لە موسڵمانان دەکەن. ناهێڵن "دەجال" بچێتە ناوی دوای ئەم حاڵەتە و تەواوبوونی چل ڕۆژەکە، ئیدی عیسا علیه سلام دادەبەزێت لە ناو دوو مەلائیکە و کاتی نوێژ دێت. ئیمانداران پێی دەڵێن، وەرەو پێش نوێژیمان بۆ بکە. ئەویش پێیان دەڵێن نەخێر بەڵکو ئێوە هەندێکتان ئەمیرن بەسەر هەندێکی ترتانەوە. ئەمەش ڕێزێکە الله لێی گرتوون، ئیمامەکەیان کە مەهدیە علیه سلام پێشنوێژیان بۆ دەکات. ئنجا لە "منارەی سپیەوە" ئەم شوێنەی کە دانراوە بۆی و لەم حاڵەتەدا کاتێک دەجال دەیبینێت ئەم دووژمنی اللەیە لە ڕیوایەتێک کە ئیمام موسلیم هێناوەتی، دەڵێت: وەک خوێ لەناو ئاو دەتوێتەوە. ئنجا ڕادەکات لەدەستی و لە ناوچەی (باب لد) کە نزیک (بيت المقدس)ە، لەویادا پێی دەگاتەوە و بە ڕمەکەی دەیکوژێت و کۆتایی بەفیتنە هەرە گەورەکەی زەوی کە لە ئادەم علیه سلام تا خاتەم فیتنـەی وا گەورە نەبووە.

دوای کوشتنی ئنجا کوشتن و لەناوبردنی گەورەترین دوژمنانی ئیسلام کە یەهودە (جولەکە) دەست پێدەکات، تاکو وای لێدێت دار و بەرد و دیوار هاوار دەکەن، ئەی موسڵمان ئەوە یەهوددییە وەرە بیکووژە تەنیا داری (غرقد) نەبێت. ئەمە پووختەی سەرجەم فەرموودەکانی کاتی کووشتنی دەجالە کەوا لەخوارەوە عەرەبیەکەی دادەنێم.

- صحيح مسلم:

عن عبد اللّه بن عمرو رضي اللّه عنهما قال : قال رسول اللّه ﷺ: (يخرج الدجال في أمتي فيمكث أربعين.. فذكر الحديث، وفيه: فيبعث اللّه عيسى ابن مريم كأنه عروة بن مسعود فيطلبه فيهلكه).

عن مجمع بن جارية الأنصاري رضي اللّه عنه يقول: سمعت رسول اللّه ﷺ يقول : (يقتل ابن مريم الدجال بباب لد)[1].

- صحيح مسلم:

عن النواس بن سمعان رضي اللّه عنه حديثا طويلا عن الدجال ، وفيه قصة نزول عيسى وقتله للدجال، وفيه قوله ﷺ : (فلا يحل لكافر يجد ريح نفسه إلا مات ونفسه ينتهي حيث ينتهي طرفه فيطلبه حتى يدركه بباب لد فيقتله).

١ وروى الإمام أحمد برقم ١٤٩٢٠ والترمذي برقم ٢١٧٠



من حديث جابر بن عبد اللّه مرفوعا، وفيه: (فينزل عيسى ابن مريم صلى اللّه عليه وسلم، فيقول أميرهم: تعال صل لنا، فيقول: لا، إن بعضكم على بعض أمراء تكرمة اللّه هذه الأمة)[1].

حديث أبي هريرة رضي اللّه عنه مرفوعا، وفيه : (فينزل عيسى ابن مريم صلى اللّه عليه وسلم، فأمهم، فإذا رآه عدو اللّه، ذاب كما يذوب الملح في الماء، فلو تركه لانذاب حتى يهلك، ولكن يقتله اللّه بيده، فيريهم دمه في حربته).

أن رسول اللّه ﷺ ، قال: (لا تقوم الساعة حتى يقاتل المسلمون اليهود، فيقتلهم المسلمون حتى يختبئ اليهودي من وراء الحجر والشجر، فيقول الحجر أو الشجر: يا مسلم يا عبد اللّه هذا يهودي خلفي، فتعال فاقتله، إلا الغرقد، فإنه من شجر اليهود).

**والحمد الله رب العالمين..**



١ مسلم في صحيحه (١٥٦)